# گوناهی ڕۆمانـنووس چییه كه خوێنەر له فێڵەكانی گێڕانەوە تێناگات!
## چاوپێكەوتن لەگەڵ كاروان عومەر كاكەسووری ڕۆمانـنووسدا
## سازدانی: توانا ئەمین

**جارێكی تر قسەكردن لەسەر ڕۆمان له پرسیاری تەقلیدی و وێرانی بۆ نووسین رزگارمان دەكات و دەمانخاتە پێش پرسیاری چۆن نووسین. گـێڕانەوەش پتر له كارەكتەر، زەمەن، ڕووداو، تەكنیك و هەر بونیادێكی تر دەهێنێت بیێته بابەتی گفتوگۆ. خوێنەری سادە و ڕۆمانی سادەگۆ ڕۆمانـنووسی دۆگما، ئەوەی به ئیشكردن بەتەنها ستیلێك خوێنەری بێ پرسیار و ساكار دروست دەكات، ئیشكالەتەكانی پەیوەندیی ڕۆمانـنووس و خوێنەر، ئەمانە بابەتی گفتوگۆیەكی ئێمەن لەگەڵ كاروان عومەر كاكەسووری ڕۆمانـنووسدا.**

*** ئەگەر ئەدەب درۆیەك بێت و ڕاستییەكان بنووسێتەوە، ئایا ڕۆمان وەكو ژانرێكی ئەو ئەدەبە چۆن درۆیەكی وەكو ژیانی بۆ دەنووسرێتەوە..؟**

ـ ڕۆمان، كه بەرهەمی شارستانیەتی ڕۆژئاوایە، هونەری دژەكان و دەنگه جیاوازەكانە، هەر بۆیە گێڕانەوە «Narration» گرنگترین ڕەگەزی ئەو ژانرە ئەدەبەیە. ڕۆمان كه لەچاو ژانرەكانی دیكەی ئەدەبدا تەمەنێكی كەمتری هەیە، بەڵام لەو ماوە كورتەیدا توانیویەتی كۆمەڵێك قوتابخانە و فۆرمی جیاواز جیاواز بێنێتە كایەوە. تەنانەت توانیویەتی جۆرێك جیاوازی لەناو خودی قوتابخانەكانیشدا بخوڵقێنێت.. تۆ هەر بۆ نموونە سەیری ئەو شەپۆلە بكە، كە له پەنجاكان تا حەفتاكان بەناوی «ڕۆمانی نوێ» له كاردا بوو. ئەوانە ئەگەرچی ناوێك كۆی دەكردنەوە و ئامانجیان تێكشكاندنی شێوازی بەلزاكییانە بوو، بەڵام هەریەكەیان لەوی تر جیاواز بوو. «ئالان ڕۆب گرێ» بایەخی به وردەكاریی شتەكان دەدا، جۆرێك لەیەكچوون و تەماهیی لەنێوان مرۆڤ و شتدا دەخوڵقاند. لای «مێشال بۆتۆر» «هەستی هۆمانیستیانە» ئامانج بوو و لای «ناتالی ساروت»یش «ڕەهەندی سایكۆلۆژی». ئەو شێوە ڕۆمانەی ئەمەریكای لاتینییش، كه به ڕیالیزمی سیحری

ناسراوە، لەپاڵ هەندێ ڕووخساری لەیەکچوودا، دنیایەک جیاوازییش لەنێوان ئەم نووسەر و ئەو نووسەریاندا هەیە. لێرەدا من ئاسوودەم بەوەی، کە تۆ دەڵێی «ئەو ژانرەی ئەدەب چۆن درۆیەکی وەکو ژیانی بۆ دەنووسرێتەوە» و ناڵێی چۆن ژیان دەنووسێتەوە، چونکە ئەدەب بەگشتی و ڕۆمان بەتایبەتی هەرگیز ناتوانێت ژیان بنووسێتەوە. ڕاستە ژیانی واقیعی سەرچاوەی ئیلهامی نووسینە و نووسەر بە کەرەسەکانی ئەو ژیانە دنیای تایبەتیی خۆی دەخوڵقێنێت، بەڵام خوڵقاندن، نەک گواستنەوە. بە بڕوای من کاری نووسەر کەم و زۆر لە کاری فڕۆکەوان و دایڤەر «غواص Diver» دەچێت، یەکەمیان دەچێتە ئاسمان و دووەمیان بۆ ژێر ئاو ڕۆدەچێت، بەڵام هەردووکیان لەسەر زەوی فێری هونەری خۆیان دەبن. ئەوەندە هەیە نووسەری ئەدەبی لەوەدا لە فڕۆکەوان و دایڤەر جیاوازە، بەوەی لای ئەو دووانە فێربوون تا ئەو کاتەیە، کە دەیانگەیەنێتە ئاستی ئەوەی بەچاکی کارەکانیان ئەنجام بدەن و لەمەوە پشت بە نەخشە و پلان دەبەستن، بەڵام لای نووسەر فێربوون کۆتاییی نایەت.. ئەو فێربوونە نابێتە پلان و نەخشە. کەواتە ناتوانێت زەویی واقیعیش بەجێبهێڵێت. بەڵێ، ئەدەب لەسەر زەویی واقیعدا مامەڵە لەگەڵ چەمکی وەهم «Fancy»دا دەکات، بەوەی کە بۆ گەیشتن بە وەهم پێویستمان بە زیاتر لە شێوەیەک گەڕان و کۆمەڵێک هەوڵ هەیە بۆ دەرخستنی لایەنە نارۆشنەکان و دواجار خوڵقاندنی وەهمێمێکی تر لەو وەهمەدا، ئەوە لە کاتێکدا خۆمان غەرقی ژیانین. هەر بۆیە زۆربەی ڕۆمانی ئێمە لەوەدا سەرکەوتوو نەبوون، کە ویستوویانە ژیان بنووسنەوە. لێرەدا ڕۆماننووسی ئێمە بە میتۆدی مێژوونووس کار دەکات و کەرەسەکەیشی هەقایەتی کوردەوارییە، کە ئەو هەقایەتەیش بمانەوێ و نەمانەوێ ستەرەکچەرێکی لاواز و تاکڕەهەندیی هەیە. خۆ ئەدەب بەگشتی و ڕۆمان بەتایبەتی، ئەگەر ژیانیش بنووسێتەوە، ئەو ژیانە دەنووسێتەوە، کە هێشتا نەهاتووە، نەک ئەوەی هەبووە یان ئێستا هەیە. واتە گرنگترین پرسیار دوای خوێندنەوەی هەر تێکستێکی ئەدەبی ئەوەیە، کە چ یۆتۆپیایەکی خوڵقاندووە. چ نەهامەتییەکە ئێمە ئەنفال و کۆڕەو و شەڕەکان وەکو خۆیان بنووسینەوە..!! دەکرێت ئێمە ئەنفالی تر و کۆڕەوی تر و شەڕی تر بنووسین، بەڵام لە دیدگای جیاوازەوە و بەشێوەیەکی هونەری. هەموومان چیرۆکی ئەو ئەنفالکراوانەمان بیستووە، کە بەڕێککەوتی سەیر ڕزگاریان بووە و گەیشتوونەتەوە زێدی خۆیان. کاتێکیش هاتوونەتەوە، هیچ شوێنێک بەخۆیانیەوە نەگرتوون. بەڵێ، ئەمە چیرۆکێکی واقیعییە و تەواو. چۆن دەکرێت ئەمە جارێکی تر بنووسیتەوە و ناوی لێ بنێیت ڕۆمان..!! کێ هەیە نەزانێت باسی کەسێکی بێماڵ بکات، کە لە کەلاوە و سەر شەقام و تەرمیناڵەکاندا

دەخـەوێت، بەڵام ئەوە زەحمـەتە تۆ باس لـە كێشـەی مـرۆڤێک بكـەیت لە باشـترین ڤێللادا دەژی و هـەسـتی پێ ناكـات. «تۆنـی مـۆریسـۆن» ئەگـەر ژیانی زنجـیـیـەكانـی وەكـو خـۆی بنووسـیـایەتەوە، ئـەوا ڕۆمـانەكـانی ئەویش وەكـو دەیان ڕۆمـانی تر تێكەڵ بە مـێـژوو و فۆلكلۆر دەبوون، بەڵام ئەو هاتووە ژیانێكی دیكەی جـیاوازی خـوڵقاندووە، كـە نازانی لە كۆێدا لە ژیانی ڕاستەقینەی ئەوان دەچێت و لە كوێدا جیاوازە. كاری ئەدەب دەرخستنی نهێنییەكانە، نەک گێڕانەوەی ڕووداوە ئاشكراكان. من لە شوێنێكدا وتوومە واقیع لای من چیرۆكنووسێكە و هەموو ساتێ چیرۆكەكانی خۆی دەنووسێ، بۆیە من وەكو چۆن نامەوێ لاسـاییی هیچ چیـرۆكنووسـێكی دی بكەمــەوە، هـەر بەم شـێـوەیەش نـامـەوێ لاسـاییی واقـیـعـیش بكەمــەوە. دیارە واقـیع یاخـود وەكـو لە پرسـیـارەكـەی ئێـوەدا هـاتووە ژیان چەمكێكی زۆر گشـتییـە و دەكرێت وردی بكەینـەوە. واتە كایەكانی دیاری بكەین. ڕۆمـان بەتایبـەتی لە ڕۆژئاوا سوودی لە كایەكانی وەكو مێژوو، ئەفسـانە، كەلەپوور، سـایكۆلۆژیا وەرگـرتووە، كـە هـەر یەكێ لەو چەمكانەیش وەكـو چـەمكی ڕۆمـان پڕن لـە پرۆبلەمـاتیكی تێگەیشتن و خـوێندنـەوە و تەوزیفكـردن. بەكـارهـێنانی مـێـژوو و ئـەفسـانـە و كـەلـەپوور پێویسـتیـان بە خوێندنەوەیەكی وردی فـەلسـەفییـانە هـەیە. «فۆكنەر» بیـرۆكـەی ڕۆمـانی «دارخـورمـای دڕندە»ی لـە تەورات وەرگـرتووە.. «كـامـۆ» لـە دیدگـایەكی فـەلسـەفـیـیـەوە «ئەفسانەی سیزیف»مان پێ دەناسێنێت. «ئۆمبێرتۆ ئیكۆ» لە هـەردوو ڕۆمانی «ناوی گوڵ» و «دورگـەی ڕۆژی پێشـوو»دا ڕەگەزی مێژووی بەكـارهێناوە.. «ئەمین مـەعلوف» و «ئۆرهـان پامۆک»یش لە ڕێگـای مێژووەوە داهێنانی چاكیـان كـردووە. شـتێكی بەڵگەنەویسـتـە، كـە هـەمـوو ڕۆمـانێک پەیوەندیی بە مـێـژوو، یاخـود بە واقـیـعـەوە هەیە، بەڵام گـرنگ ئەوەیە ڕۆمـانـنووس واقـیـعـێكی تایبــەت و مـێـژووێكی تایبــەت بەخـۆی دروست بكات، چونكە بەكـارهێنانی مێژووی واقیعی، یاخـود با بڵێین مێژووی ڕەسـمی وا دەكات كارەكتـەر لە سنوورێكی تەسكدا هەڵبسـوڕێت و بەئاسـانی نهێنیـیـەكانی دەربكەوێت. واقـیع و مێژوو دەبنـە دەسـتـەڵاتێک و كـۆنتـرۆڵی دەكـەن. مـێـژووی ڕەسـمـیـیش هەمـیـشـە مـێـژووی دەسـتــەڵادارانە، بۆیە ڕۆمــان بوارێكی فـرەوانە بۆ خـوڵقـاندنی واقـیـعـێكی جـیـاواز و مێژوویەكی جیاواز. كەواتە كاری ڕۆماننووس نـووسینەوەی ڕووداوی مێژوویی، یاخود بە مانایەكی تر نووسـینەوەی ژیان نییـە، بەڵكو پێشـبـینیكردن و خوڵقاندنە. ڕوونتـر بڵێم نووسـەری ئەدەبی هەتا ئەگـەر بە واقـیع و مـێـژووی ڕابردووشـدا بچـێـتـەوە، ئەوا لە دیدگـایەكی جیـاوازەوە دەیانگێـڕێتـەوە، وەكو ئەوەی «گـۆنتـەر گـراس» لە ڕۆمـانەكانیـدا دەرهـەق بە مێژووی ئـەڵمانیـای سـەردەمی نازی كردوویەتی. «گۆنتـەر گراس» مێژوویەكی

لەبیرکراوی لە ڕێگای چیرۆکەکانیەوە دەرخستووە، کە هەندێکیان لەسەر زمانی ئاژەڵان و بەشێوەی ساتیرئامێز نووسراون. مامەڵەکردنی ڕۆمان لەگەڵ مێژوودا وای کردووە ئەو چەمکە ببێتە بەشێکی گرنگ لە کارەکانی «سیگمۆند فرۆید» و «جۆرج لۆکاش» و «لۆسیان گۆڵدمان» و «میخایل باختین» و «ڕینییە جیرار». ئەمە دەربارەی مێژوو و کەلەپوور و ئەفسانە. دیارە ڕۆمان سایکۆلۆژیاشی بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی دیوی ناوەوەی کارەکتەری هاوچەرخ بەکارهێناوە. ڕەخنەگران پێیان وایە نووسەرانی وەکو «دۆستۆفسکی» و «جیمس جۆیس» لەپێش زانایانی سایکۆلۆژیا دەرکیان بە هەندێ دیاردەی سایکۆلۆژی کردووە.. کەواتە ڕۆمان وەکو «مێلان کۆندێرا» دەڵێت هونەری ئێستا و ڕابردووە و لە توانایدا هەیە هەموو شتێک قەبووڵ بکات... بۆیە من پێم وایە لە دەستی دێت ژیانێکی جیاوازیش بخوڵقێنێت.

*** باسی گێڕانەوەت کرد، کە ڕەگەزێکی گرنگی ڕۆمانە . ئایا تۆ پێت وایە ئەو گرنگییە تەنها لە شێوازدایە، یان دەبێتە پێکهاتەیەک لە جەستەی تێکستدا . .؟ ئایا شێوازی گێڕانەوە دەتوانێت بابەتی گێڕانەوە قووڵ بکاتەوە، یاخود بە لایەکەی تریشدا بەرەو سادەیی و کاڵوکرچیی ئاڕاستەی بکات . .؟**

ـ تیۆری گێڕانەوە، واتە ناراتۆلۆژیا یەکێکە لەو چەمکانەی، کە بۆتە جێگەی سەرنجی زۆر لە نووسەرانی دنیا و گرنگییەکی بەرچاوی پێ دراوە. ڕەخنەگرانی ئەدەب دەڵێن ڕەگوڕیشەی بۆ لای «ئەرستۆ» دەگەڕێتەوە. بەڵام لە کۆتاییی پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا زیاتر برەوی پەیدا کرد. «کلۆد لیڤی شتراوس» لە کتێبی «ئەنترۆپۆلۆژیای بونیادگەری»دا بایەخی بە تیۆری گێڕانەوە دا و دوای ئەویش «ڕۆلان پارت» و «جیرار جینێت» و «والاس مارتن» چەمکی ناراتۆلۆژیان بەشێوەیەکی بەرچاو بەکارهێناوە. چیرۆک و ڕۆمانیش توانیان گۆڕانێکی گەورە بەسەر ئاستەکانی گێڕانەوەدا بێنن. لای «مارسێل پرۆست» و «فرجینا ولف» و «جیمس جۆیس» و «ولیەم فۆکنەر»دا شێوازی گێڕانەوە زۆر گرنگترە لە بابەتی گێڕانەوە. هەروەها نووسەرانی «ڕۆمانی نوێ»یش شۆڕشێکی گەورەیان لە دژی سادەیی و ڕەوانی هەڵگیرساند و تەکانێکی بێوێنەیان بە شێوازەکانی گێڕانەوە دا. «کلۆد سیمۆن» کۆمەڵێ بابەت و ڕووداوی جیاواز، کە نە لە زەمەن و نە لە شوێندا ناگەنەوە یەک، تێکەڵی کردوون، بەڕادەیەک ئاسان نییە خوێنەر بتوانێت پێکەوەیان بلکێنێت. دیارە چیرۆکنووسانی کوردیش لە حەفتاکان، بەتایبەتی حسەین عارف و و یەک دوو ناوی تر لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە هەندێ شارەزاییان لەو

بوارەدا پەیدا کرد و توانیان گۆڕانێک بەسەر شێوازی گێڕانەوەدا بێنن. دەبووایە ڕۆمانیشمان لەگەڵ خۆیدا فۆرمێکی جیاوازی بهێنایەتە کایەوە و پەرەی بەو شێوازە بدابووایە، کە لە حەفتاکان لەسەر دەستی ئەو چەند چیرۆکنووسە، بەتایبەتی لە کوردستانی باشووردا هاتە کایەوە، بەڵام بەداخەوە ڕۆمانی کوردی ئاستەکانی تەکنیکی گێڕانەوەی بەرەو سالانی پێش حەفتا دابەزاند. زۆربەی ڕۆمانەکانی ئێمە، ناڵێم هەموویان، بە تەکنیکی گێڕانەوەی ئاسایی نووسراون. من پێم وایە گێڕانەوە بێجگە لەوەی دەتوانێت نهێنییەکانی ڕابردووی کارەکتەر دەربخات و سەربەستییەکی زیاتری پێ ببەخشێت، تا زیاتر تەعبیر لە خودی خۆی بکات، ئەوا لایەنێکی ئیستاتیکیشی هەیە، کە خۆی لە کۆمەڵێ فێڵی هونەرییدا دەبینێتەوە. گێڕانەوە جیاواز جیاوازەکان لە ناو تێکستێکدا دەتوانن دەنگە جیاواز و دژەکان دەربخەن، کە ئەمە خۆی تایبەتمەندییەکی ژیانی شارە، بەوەی پێچەوانەی لادێ، بە فرەدەنگی و فرەڕەنگی دەناسرێتەوە و خودی ڕۆمانیش زادەی ئەو سەردەمەیە. من باوەڕم نییە گێڕانەوە تەنها پەیوەندیی بە فۆرمی تێکستەوە هەبێت، بەڵکو پێش هەموو شتێک ئایدیاکانی نووسەر دەردەخات و ئاستەکانی بینینی ئەومان بۆ ئاشکرا دەکات لەو پەیوەندییەدا، کە لەنێوان کارەکتەر و ڕووداو، کارەکتەر و زەمەن، کارەکتەر و شوێن، کارەکتەر و زماندا دەیخوڵقێنێت. شێوازی گێڕانەوە لە چیرۆک و ڕۆماندا وەکو ئاواز وایە لە گۆرانییدا. زۆر جار لە شیعرێکدا هیچ جوانکاری و توانایەکی هونەری نابینین، کەچی میلۆدیستێکی شارەزا میلۆدییەکی چاکی بۆ دادەنێت و سەرسامان دەکات. من ئێستا هەوڵ دەدەم بە نموونەی سادە ئەم مەسەلەیەی شێوازی گێڕانەوە و بابەتی گێڕانەوەیە دەربخەم. ژنێک لە دەستەخوشکەکەی پرسی: ئەرێ ئەو پیاوە چییە لە بەردەمی ئەو بیرە وەستاوە و هەر دەڵێ دە.. دە.. دە..؟! ئەم بەسەرسوڕمانەوە وتی: نازانم..!! ئەوە کەمێک لەمەوپێش دەیوت نۆ.. نۆ.. نۆ. مێردەکەم چوو لێی بپرسێت، تا بزانێ ئەمەی لە چییە، کەچی پاڵێکی پێوە نا و خستیە ناو بیرەکەوە. ئینجا لەمەوە دەستی کرد بە دە.. دە.. دە..... تۆ بڕوانە «کاک توانا ئەمین». ئەگەر ئێمە لە سەرەتاوە ئەو چیرۆکە بگێڕینەوە، واتە بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆژی، ئەوا ئەو ڕووداوە هیچ گرنگییەک نابەخشێت و دیالۆگەکان سەرسامان ناکەن، چونکە ڕەگەزی تامەزرۆیی و ناکاوی و جوانکاری و زۆر شتی دیکەی لە دەست دەدات و حاڵەتە سایکۆلۆژییەکانیش ئاوا بە قووڵی دەرناکەون. هەر لێرەدا سەرنجی تێکەڵبوونی کات و شوێنیش بدە. بیرۆکەی ئەو چیرۆکە ئەوەیە، کە پیاوێک هەر خەڵک دەخاتە ناو بیرەوە و دەیانژمێرێت. ئەمە چ گرنگییەکی تێدایە، ئەگەر هێزی گێڕانەوە نەبێت..!! خۆ ئەگەر ئەو

ژنە بەو شێوەیە باسی مێردەکەی خۆی نەکردایە، ئێمە هەرگیز حاڵەتی نۆیەکەی تریشمان نەدەهاتە بەرچاو. واتە ئەو دیالۆگە، بەو شێوە گێڕانەوە سەیرە، کەسەکانی لە ژمارەوە گۆڕی بۆ ڕۆح و هاوکات زەمەنێکی پچڕپچڕیشی بۆ ئاشکرا کردین، کە زەمەنی زیندەبەچاڵکردنی دە مرۆڤە.. پارادۆکسالی ئەو گێڕانەوەیە، لە دوو بڕگەی نەزانراو و زانراو پێکهاتووە. سەرەتا وتی «نازانم»، ئەمەی بە تۆنێکی زۆر جدی و بەرپرسیارانەوە دەربڕی، وای تێگەیاندین ئێمە لە زمانی ئەوەوە هیچ زانیارییەکمان دەستناکەوێت، کەچی شەش ڕستەکەی تری، کە گرنگیی مەسەلەکە دەردەخەن، زۆر بەبێ بایەخ گێڕایەوە....
ئەمەیش نموونەیەکی تر: دکتۆری سایکۆلۆژیا بە نەخۆشەکەی وت: کاکە مادام تۆ دەڵێی لە گەرمەی ئیشکردندا تووشی دڵەڕاوکێ و ماتەمینی دەبیت، دە هەوڵ بدە لەو کاتەدا گۆرانی بڵێیت. پیاوەکە وتی: ناتوانم، ناتوانم..!! ئەمە زۆر زەحمەتە..!! دکتۆر وتی: بۆ زەحمەتە..؟! شتێک هەیە لەوە ئاسانتر..؟! پیاوەکە وتی: قوربان من مردووشۆر و گۆڕهەڵکەنم.... ئەگەر پیاوەکە هەر لە سەرەتاوە بیوتایە مردووشۆر و گۆڕهەڵکەنە، ئەوا تێڕوانین و ئامۆژگارییەکانی دکتۆریش دەگۆڕان و چیرۆکێکی هونەریی لێ دەرنەدەچوو.
ئایا ئێستا ناتوانین بڵێین شێوازی گێڕانەوە ئەگەر لە بابەتی گێڕانەوە گرنگتر نەبێت، ئەوا بەقەدەر ئەو گرنگە..؟! بەڵام گوناهی ڕۆماننووس چییە، کە خوێنەر لە فێڵەکانی گێڕانەوە تێناگات و هەندێ نووسەریش تێکستەکەی بە وڕێنە تاوانبار دەکەن..؟! ئەگەرچی وڕێنە لە گێڕانەوەدا گرنگییەکی زۆری هەیە، بەتایبەتی لەو ڕۆمانانەی بە ڕێگای شەپۆلی هۆش نووسراون.

*** تێکست لەوێ لە موڵکایەتیی نووسەر دەردەچێت، وەختێک یەکەم خوێنەر دەیبینێت.. کامە تێکست لە دوای نووسینی نووسەرەکەی خۆی ناکوژێت..؟**

ـ لێرەدا نابێت خۆکوشتن و مردن تێکەڵ بە یەکدی بکەین و ناچاریشین ماهیەت و باکراوەندی ئەو خوێنەرە لەگەڵ جۆری تێڕوانینی دەربخەین. واتە مەبەستمان لە چ خوێنەرێکە و لە چ ناوەندێکی کەلتووری و ڕۆشەنبیریدا پێگەیشتووە..؟! ئەو خوێنەرە چەند تێکستی قورسی خوێندۆتەوە..؟! چەند لە هونەری نووسین شارەزایە..؟! بۆچی و بە چ مەبەستێک دەخوێنێتەوە..؟! مردن پرۆسەیەکی سرووشتییە و وەکو مەسەلەیەکی دوالیزمی و ئەنتۆنیمی پێچەوانەی ژیانە، بەڵام خۆکوشتن پرۆسەیەکە کەم و زۆر لەناو سیستەمێکی ئیرادەگەرییدا بەڕێوە دەچێت. خۆکوشتن لە دیدی «ئەلبێرت کامۆ»وە شێوازێکی یاخیبوونە و ئەنجامی دەرککردنی تەواوی واقیعێکی دیاریکراوە. بەڵێ،

خۆكوشتن ئەو كاتەیە، كە كێشەی نێوان خود و بابەت بە بنبەست دەگات. تێكستێك خۆی دەكوژێت، كاتێك زەمینەیەكی باشی دەستناكەوێت بۆ ژیان. لێرەدا دەبێت ئەمە لە مەسەلەی زانستی بایەلۆژیی ڕووت جیا بكەینەوە، بەوەی دەیان جۆر مرۆڤ و ئاژەڵ و باڵندە و ماسی بە مانا داروینییەكەی بەپێی یاسای مانەوە بۆ چاكترین و لە ئەنجامی نەبوونی دەوروبەری گونجاو، یان تێكچوونی ئەو دەوروبەرە لەناوچوون، واتە لەژێر جەبری واقیعدا مردن، نەك وەكو ئیرادەیەك مەرگیان هەڵبژارد. جیاوازییەكە لە مەرگە وەكو كۆ و وەكو تاك. دیارە بابەتی كێشەكەیش جیاوازە. ئەگەر باوەڕمان هێنا، كە تێكست ڕۆحی دووەمی نووسەرە، ئەوا دەبێت باوەڕ بەوەیش بێنین، كە بوونەوەرێكە و پێویستی بە ژینگەیەكی گونجاو هەیە. بەدەگمەن تێكستە جدییەكان، ئەوانەی هەڵگری كۆمەڵێك پرۆبلەماتیكی فیكری و هونەریین، ژینگەی گونجاویان دەستدەكەوێت. ئەو تێكستانە خۆیان دەكوژن، كە دژایەتیی لەگەڵ تێڕوانینی باوی واقیعدا دەهێننە كایەوە. ئەوانەی بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن و دۆزینەوەی كۆدەكانیان پێویستی بە گەڕانە بەدوای مەعریفەی زیاتردا. بەڵام بیرت نەچێت لە ڕوانگەی «بوودا»وە ڕۆح سەرمەدییە. ئەمڕۆ لە شتێك تەواو دەبێت و سبەینێ لە شتێكی ترەوە دەست پێدەكاتەوە. ئەو مەسەلەی نێرڤانایە بۆ ئەدەبیش هەر ڕاستە. كەم نیین ئەو تێكستانەی ڕۆژگارێك وەكو مردوو حیسابیان بۆ كراوە و دواتر تا ئەبەد بەزیندوویی ماونەتەوە. كێن ئەوانەی ژیان و مردن بە تێكستێك دەبەخشن..؟! بە مانایەكی دی كێن ئەوانەی وا لە تێكستێك دەكەن ئاسوودە بژی و وا لە یەكێكی تر دەكەن خۆی بكوژێت..؟! ئێستا جارێكی تر مەسەلەی خوێنەر دێتە كایەوە. لێرەدا مەبەستمان لە خوێنەر ئەو كەسانەن، كە دەكەونە دەرەوەی نووسەری ئەو تێكستەوە. دەشێ ئەو خوێنەرە هاوكات نووسەریش بێت. هەردەم لەگەڵ چەمكی خوێنەریش، چەمكێكی تر هەیە، ئەویش چەمكی ڕەخنەیە. ئایا ئێمە خوێنەرێكی ڕەخنەگرمان هەیە، كە لە توانایدا بێت وەكو كەسێكی ئاكتیڤ تێكستەكان بخوێنێتەوە و چاوەڕێ نەبێت لە دەستی دووەمەوە حوكمەكان وەربگرێت..؟

*** یەكێك لە ڕۆماننووسە ناودارەكان دەڵێت دەبوو كارەكتەرێكی ناو ڕۆمانەكەم بكوژم، زۆرم هەوڵدا نەكوژرێ و چار نەبوو، هەر دەبوو بكوژرابایە.. دواجار كوشتم، بەڵام چەند ڕۆژێك بۆی گریام. تۆ باوەڕت وایە ئەم ڕاستگۆییە لەوەوە هاتووە، كە ڕۆماننووس كۆنترۆڵی خۆی لە دەست دەدات، یان ئەوە كارەكتەرەكانن، كە وەكو سرووشتی خۆیان ناچنە ژێر ڕكێفی نووسەرەوە..؟**

ـ نازانم ئەو ڕۆمـاننووسـە کـێیـە، بەڵام من خـۆشم لە گەرمـەی نووسـینی ڕۆمـانی «ئای لەڤیلیا لەڤیلیا..!!»دا کاتێ دەمویست یەکێ لە کارەکتەرەکانم بکوژم، حاڵەتێکی ئاوام بۆ پێش هـات. لەو چاوپێکەوتنەمـدا، کـە گـۆڤـاری «ڕامـان» سێ سـاڵ لەمـەوبەر لەگـەڵیـدا کـردووم، ئاماژەم پێی داوە. لەوێدا وتوومـە لای من مـردن پێش ئەوەی هـەر شـتـێک بێت، کارێکی هـونەرییە. ئێستایش وەکو ئەوسا دەڵێم مـەرگ بەو هـەموو قـورساییـەی خۆیەوە و بەو فـەزا درامـاتیکیـیـەی دەیـهـێنێـتـە کـایەوە، هیچ کـاتێک کـۆتایی نیـیـە، بەڵکو دەسـتـپـێکردنەوەیەکی دیکەیە بە شـێـوازێکی جیـاوازتر. ئەمـەش ئەو جـیـاوازییـەیە، کـە دەمـەوێ لەنێـوان ناوی «مـردن» و لەو کـردارەی لـە چاوگی «کـوشـتن»دا وەردەگـیـرێت، بیدۆزمـەوە. مەبەستمە بڵێم ئەو کردارە لەژێر دەستەڵاتی گراماتیکدا دەرچووە و لە ڕووی لۆژیکیـشـەوە ئەرکی ڕاسـتـەقـینـەی خـۆی لە دەست داوە. ڕوونتـر ئـەو ڕۆحـانەی لـەناو تێکستدا دەکوژرێن، ناوی مردوویان بەسەردا ناسەپێت، بەڵکو لەناو فەزایەکی بێسنووردا بۆ شتـی تر دەگۆڕێن.. «مـاکس فیبەر»یش لە مـحازەرەی «زانست بەو مـانایەی بانگەواز و پیشـەیە»دا دەڵێت: «مردن بۆ مـرۆڤی مۆدێرن، مـرۆڤی کەلتـوور، هـیچ مانایەک نابەخـشێت، چونکە ژیانی ئەو غەرقی پێشکەوتن و سـەرمەدییەتە.... ناکرێت ژیانێکی ئاواهـی کۆتاییی هـەبێت..... کـەسـێک نیـیـە لـەوانە بگاتـە لووتکە، چونکە ئـەو لووتکەیـە تەنهـا لە فـەزای بێسنووردا بوونی هـەیـە.... ئیبراهیم خـەلیل، یاخود جوتیـارەکانی ڕابردوو دوای ئەوەی لە ژیان تـێـر بـوون، ئـینجـا مـردن، چونکـە ئەوان لـە چوارچێـوەی ژیانـی ئۆرگـانیکیـدا دەیانگوزەراند.. ئەم ژیانەش لە کۆتاییی تەمەنیاندا هـەموو مانایەکی پێ دەبەخشین و هـیچ لوغزێکیان لە بـەردەمدا نەدەمـایەوە، تا هـەڵیبێنن». بەهـەر حـاڵ ئەم پرسـیارەت تەواوکـەری پرسـیـاری پێـشـووتـە. من پێم وایە ئەوەی مـافـی خـولقـاندنی ڕۆحـێکی هـەبێت، مـافی ئەوەیشـی هـەیە بیکوژێت، بەچاوپۆشین لەوەی چی ناچاری دەکات و چ ئازارێک دەچێژێت. بەڵێ، ئەگـەر خـەڵقکردن، هونەرێک بێت، ئـەوا کوشتنیش هونەرێکی ترە. ئەو کوشـتنەیش، کە لەلایەن نووسـەرەوە دێتە کایەوە، پرۆسـەیەکی جیاوازە لەو پرۆسـەیەی، کە لە دەرەوەدا، واتە لەلای خوێنەرەوە جێبەجێ دەکرێت، وەکو لە وەڵامی پرسیاری پێشووتدا ئاماژەم پێی دا. تۆ کارەکتەرێک دەکوژی، تا جیـاوازییەک بێنیتـە گۆڕێ. تا کۆمەڵێک تێڕوانینی ناکۆک ناکۆک لەمەڕ مەرگ و ژیانەوە پیشان بدەیت. تا کێشەی نێوان خود و بابەت بورژێنیت. تا گـرنگیـی بوونی ئەو کـارەکـتـەرە لای خـوێنـەران ئاشکرا بکـەیت. من سـەرنجت بۆ بەرهـەمـەکانی خـۆم ڕادەکێشم، بەوەی کـارەکتـەرەکانم دوای ئەوەی دەمرن، ئینجا زیاتر لەناو تێکستەکەدا ئاکتیڤ دەبن، چونکە لە گێڕانەوەدا کرۆنۆلۆژیا هیچ بایەخێکی نییە،

بگره زاڵبوون بەسەر دەستەڵاتی ئەو کرۆنۆلۆژیایە، هەر خۆی سڕینەوەی سنوورەکانە لەنێوان ژیان و مەرگی کارەکتەرەکاندا، بەڵام من کە بۆیان دەگریم، لەبەر ئەوەیە لە پشت ئەو پرۆسیسە هونەرییەوە، کە دەبێت بەناچاری ئەنجام بدرێت، دنیایەکی ترم لێ دیارە، کە بەلای خوێنەرەوە جۆرێکە لە غەیب. لە سەرجەمی ئەمانەدا دەمەوێ پێت بڵێم پرۆسەی کوشتن لای من ئارەزووێک نییە، بەڵکو ملکەچییە بۆ دەستەڵاتێکی هونەری. واتە مەرگ لەناوەوەی کارەکتەردا ڕوو دەدات، نەک لە دەرەوەی. سەرەتای ژیانمی لێ دەربچێت، ئەگینا هەرگیز بیرم نایە هیچ کارەکتەرێکم لەپێناوی خۆشەویستکردنی مەسەلەیەکی ئایدۆلۆژی گیانی لە دەست دابێت.

*** هەست ناکەیت زۆر جار چیرۆکبێژ لە ڕۆمان و چیرۆکیشدا خودی نووسەر خۆی بێت، بەوەی قودرەتێکی ئیلاهی هەیە بەسەر ڕووداوەکان و وردەکارییەکانی ناو چیرۆکەکەدا، یان بە جۆرێکی تر کارەکتەری سەرەکی و چیرۆکبێژ و نووسەر هەر یەکێک بن بەتایبەتی لای ئەوانەی یەکەم ڕۆمانیان نووسیوە..؟**

ـ بەڵێ، ڕێک وایە، بۆیە «جیمس جۆیس» دەڵێت: «ڕۆماننووس تەنها یەک ڕۆمان دەنووسێت». واتە ئەوانەی تر تەواوکەری ئەوەی یەکەمن. من پێم وایە ئەوەی جیاوازیی نووسینی نووسەرێک لەگەڵ نووسینێکی تریدا دێنێتە کایەوە، ئەو گۆڕانەن، کە بەسەر کات و شوێن و حاڵەتە سایکۆلۆژییەکانیدا دێن. دیارە ئەوانە بەشێوەیەکی ڕێژەیی کار لە نووسەر دەکەن. مەبەستم ئەوەیە مەرج نییە بە یەک ئاڕاستە و بە یەک ڕادە کار لە هەموو نووسەرێک بکەن. نووسینیش وەکو «سیگمۆند فرۆید» بۆی دەچێت ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەی نووسەرەکەیە، نەک ئەزموونی ڕاستەقینەی ژیانی. واتە نووسەر بەشێک لە خەیاڵەکانی خۆی بە ئێمە دەڵێت. بێجگە لەوەی لە ڕێگەی سومبولەکانەوە کۆمەڵێک تەمومژی بەدەوردا دەخوڵقێنێت، ئەوا تا بۆشی بکرێت لە خۆی دووری دەخاتەوە. بۆ نموونە ئەو نووسەرەی کچی یان کوڕی شارە و باس لە جوتیارەکان دەکات، مەرج نییە حەزی لە لادێ بێت، بەڵکو مەبەستیەتی خوێنەر چاوبەست بکات و بە نهێنییەکانی نەزانێت. هەر بۆیە «لۆسیان گۆڵدمان» باوەڕی بەوە نییە تێکستی ئەدەبی تەنها لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە بخوێندرێتەوە، چونکە یەکێک لەو هۆیانەی ڕێگرە لەوەی ئەو پرۆسەیە بەچاکی بەڕێوە بچێت، ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین زانیارییەکی زۆر لەبارەی ژیانی ڕاستەقینەی نووسەرەوە بەدەستبهێنین. کارەکتەری سەرەکی ئەگەرچی سەرەتا لای نووسەر خۆشەویستە، بەوەی دەبێتە بەربەستێک لەنێوان «ئیگۆ»ی ئەم و هێرشی

دەوروبەر، واتە هەموو ئارەزووەکانی نووسەر دەخاتە ئەستۆی خۆیەوە و دواجار ئەوە لەجیاتی نووسەر ڕیسوا دەبێت، بەڵام هێندەی پێ ناچێت وەکو دوژمن دێتە بەرچاوی، چونکە جێگای ئەو داگیر دەکات و بیرۆکەکانی دەشێوێنێت. کۆنترۆڵی دەکات و ناهێڵێت بە ئازادی و ڕاشکاوانە هەست و ئارەزووکانی دەربڕێت. ئێستا نووسەر ئەوەندە هەڵپەی ئەوەی نییە تێکستێکی تر بنووسێت، بەقەدەر ئەوەی مەبەستیەتی شوێنی ڕاستەقینەی خۆی وەربگرێتەوە. گەرەکیەتی ئازادییە زەوتکراوەکانی بەدەستبهێنێتەوە، بەڵام تووشی هەمان ترس و دڵەڕاوکێ دەبێتەوە و ناچارە کارەکتەرێکی تر و دوان و دەی تر بخوڵقێنێت. بە مانایەکی دی کۆمەڵێک تێکستی تر بنووسێت. با مەسەلەکە لە ئاستێکی تر و بە ئاڕاستەیەکی تردا بخوێنینەوە. پەیوەندیی نێوان کارەکتەر و نووسەر بە دوو شێوەیە. یەکەمیان ئەوەی، کە نووسەر دەیەوێت لە ڕێگەی ئەو کارەکتەرەوە تەعبیر لە شتە حەرامەکان بکات. ئەو میکانیزمە لە سایکۆلۆژیادا بە «Projection» ناسراوە. شێوازێکی پاساوهێنانەوەیە بە مەبەستی بەرگریکردن لە خود. نووسەر هەموو ڕەفتارە ناپەسەندەکانی خۆی، ئەوانەی کۆمەڵگا بە تابوویان دەزانێت، دەخاتە ئەستۆی ئەو کارەکتەرەوە. ئەمە لەو حاڵەتەی، کە نووسەر کارەکتەری نێگەتیڤ دەخوڵقێنێت، ئەو کارەکتەرەی گوێ بە ترادشیۆنەکان نادات. ئەمەیان لە ئەدەبی ئێمەدا هەر زۆر زۆر کەمە. بەڵام بە لاکەی تردا، واتە لە حاڵەتی دەرخستنی کارەکتەری پۆزەتیڤدا، ئەوەی پەیڕەوی دابونەریتە باوەکانی کۆمەڵگا دەکات، ئەمەیان لە سایکۆلۆژیادا خۆی لەمیکانیزمی کاردانەوەی پێچەوانە «Reaction Formation» و بەرزگەرایی «Sublimation»دا دەبینێتەوە. ئەو دوو میکانیزمە، ئەگەرچی هەندێک لە یەکتر جیاوازن، بەڵام لە زۆر شتدا وەکو یەکن. یەکەمیان ئەوەیە مرۆڤ، دیارە لێرەدا مەبەستمان کارەکتەری ئەدەبییە، بەشێوەیەکی جیاواز سیفەتەکانی خۆی پیشان دەدات. بۆ نموونە پیسکەیەک وەکو بەخشندەیەک، یان ترسنۆکێک وەکو ئازا خۆیمان پێ دەناسێنێت. ئەمە لە ئەنجامی دڵەڕاوکێوە دێتە کایەوە. دووەمیان کاتێ مرۆڤ، دیسان مەبەستمان کارەکتەری ئەدەبییە، ناتوانێت ئارەزووەکانی لە واقیعدا جێبەجێ بکات، بەتایبەتی ئارەزووی سێکسی، ئەوا ناچار دەیانگۆڕێتەوە بۆ چەند ئارەزووێکی تری وەکو وەرزش و خوێندنەوە، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەسەندن.. ئەو شێوە کارەکتەرە، واتە ئەوانەی بەپێی ئەو دوو میکانیزمە بەڕێوە دەچن، لە ئەدەبی ئێمەدا زۆر زۆرن. بەتایبەتی لەو تێکستانەی بەمەبەستی ئایدۆلۆژی و ئاینی نووسراون. ئەوانەیش، کە ڕەچاوی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەکەن.. بۆ نموونە کارەکتەرە سەرەکییەکانی «سەلاح عومەر» هەمیشە چاکەخوازن. زوڵم لە کەس

ناکەن و بەردەوام لە لایەن ئەوانی ترەوە دەچەوسێنەوە. هەموو خەتایەک لەسەر خۆیان لادەبەن و دەیانخەنە ئەستۆی ئەم و ئەوەوە. تا بۆیان بکرێت خۆیان لەگەڵ دابونەریتەکاندا دەگونجێنن. نوێژ دەکەن، دوعا دەخوێنن. یارمەتیی لێقەوماوانی دیکەی وەک خۆیان دەدەن. ئەمەش وای کردووە زمانێکی شەفاف، ئەو زمانەی هەر کەسێکی تری ئاسایی کەلتوری کوردی پێی دەدوێ، بەکاربهێنن. سەیر نییە ئەگەر لەسەر زمانیان گوێمان لە دەیان پەند و ئیدیۆم و ئامۆژگاری بێت. ئەگەرچی «سەلاح عومەر» لەم ساڵانەی دواییدا، بەتایبەتی دوای دەرچوونی یەک دوو ڕۆمانی جیاوازی کوردی، گۆڕانکاریی لەو شێوە زمانەیدا کردووە، بەڵام هێشتا تەواو دەستبەرداری نەبووە. «شێرزاد حەسەن» هەر لە سەرەتاوە کارەکتەری نێگەتیڤی هێناوەتە ناو چیرۆکەکانی، بەڵام ئەویش لە ڕۆمانەکانیدا بەتایبەتی لە «تەمی سەر خەرەند»دا بە هەندێ جیاوازی لەگەڵ «سەلاح عومەر»دا زۆر پاساو بۆ بێگوناهی و پاکیی کارەکتەرە سەرەکییەکانی دەهێنێتەوە. لای «بەختیار عەلی» مەسەلەکە بەو سادەییە نییە، بەتایبەتی لە «مەرگی تاقانەی دووەم»دا. جۆرێک دژایەتی هەیە لەنێوان نووسەر و هەر یەکێک لە کارەکتەرەکانیدا. ئەمەیش وای کردووە کۆمەڵێ دەنگی جیاواز خۆیان دەربخەن و زیاتر لە ئەتمۆسفێرێکیش بەدی بکەین، کە بە ڕای من ئەمە گرنگترین شتی ناو ئەو ڕۆمانەیە. ڕۆمانی «دنیا لە کتێبێکدا»ی «جەبار جەمال غەریب»یش لەم ڕووەوە هەوڵێکی باشە. «ئەندێشەی مرۆڤێک»ی «حسێن عارف»، کە لە نیوەی دووەمی هەشتاکاندا نووسراوە پێچەوانەی ڕۆمانی «شار»، نموونەیەکی دیارە لە خوڵقاندنی کارەکتەری دژ. ئەو ڕۆمانە ئەگەرچی زۆر کەم بۆتە جێگای مشتومڕ، بەڵام هێزی تەکنیک و شێوازی گێڕانەوەی بێوێنەن.

*** ڕۆمان لە ئەدەبی کوردییدا هێشتا نوێیە و لە دەرەوەیش شەپۆلێک هەیە باس لە مەرگی ڕۆمان دەکات.. لات وایە ئەم ژانرە لای ئێمەیش تووشی ئەم مەرگە ناوەختە ببێت..؟ ئەگەر وابوو ئەوا ڕۆمانی کوردی تا ئێستا چی خستۆتە سەر جیهانبینیی ئێمە..؟**

ـ لە میانەی وەڵامی پرسیارەکانی پێشووتدا کەم و زۆر لە دیدگای تایبەتیی خۆمەوە باسم لە ڕۆمانی کوردی کرد. ئەوەی ماوەتەوە لێرەدا هەر لە دیدگای تایبەتیی خۆمەوە بیڵێم ئەوەیە، کە ڕۆمانی کوردی جۆرێک ئاسانکاریی هێناوەتە گۆڕێ و خوێنەری لەسەر گوێگرتن ڕاهێناوە. دیارە کە وا دەڵێم، لە بیرمە یەک دوو ڕۆماننووسی بەهرەمەندیشمان هەن. ڕۆماننووسی کورد بەپێچەوانەی «بۆرخیس»ەوە، کە ڕێگومکە «Maze»ی دەخوڵقاند و چێژی لە ریسکەکاندا دەبینی، ئەو خۆی لە ڕێگومکەکان لادەدات و حەزی لە

مەترسییەکان نییە. ترسێکی گەورەی لە تێکشکان و ڕیسوابوونە، بۆیە هەمیشە بەدوای ئەوەوەیە سەرکەوتوو بێت. ئەو میکانیزمی بەرزگەراییە ڕۆماننووسی ئێمەی کردۆتە پیاوچاکێک و کارەکتەرەکانی وەکو کەسانێکی دانەبڕاوی کەلتوری کوردی دەردەخات. هەرگیز ڕێگایان پێ نادات وەکو «دۆنکیخۆت»ی «سێرڤانتس» بە تێکشکاوی و بە ڕیسوایی بۆ ناو ئاوەدانی بگەڕێنەوە. ئەو ئاشی بایەی «دۆنکیخۆت» بەگژیدا چوو، کە ئەمڕۆ گۆڕاوە بۆ دەستەلاتی خێزان و قوتابخانە و مزگەوت و دامودەزگاکانی دەولەت، هیچ کێشەیەک لەگەڵ ئەو کارەکتەرە ناهێننە کایەوە، بگرە جۆرێک تەماهیی لەگەڵدا کردوون. ڕۆمانی کوردی لە سەرجەمدا گوتارێکی پۆتێنسی «Potency» فحولی»ی خولقاندووە، بەوەی تا ئێستایش ڕەگەزی پیاو بەهەمان شێوەی پیاوی ناو واقیعی کەلتووری کوردی، هەڵسوڕێنەری تێکڕای ڕووداوەکانە و هەموو ئەنجامەکانیش بەپێی خواستەکانی ئەو تەواو دەبن. ئەمانەییش بەشێکیان لەوەوە هاتوون، کە ڕۆماننووسی کورد ڕۆشنبیرییەکی فرەلایەنی نییە. تا ئێستا زۆر زۆر بەدەگمەن ڕێککەوتووە بیرۆکەکانی ڕۆمانێکی کوردی لە تێڕوانینی فەیلەسووفێکەوە نزیک بن، یاخود پاڵیان پێوە نابن لە فەلسەفەوە، یان لەناو تیۆرەکانی سایکۆلۆژیا و سۆسۆلۆژیا و کایەکانی تردا بۆ کردنەوەی کۆدەکانیان بگەڕێن، بەڵکو هەمیشە دەمانبەنەوە ناو واقیعی باوی ژیانی ئاشکرای خۆمان. ئەوەندەی شتەکانی خۆمانمان بەبیر دەهێننەوە، ئەوەندە ناچارمان ناکەن بەدوای نهێنی و لوغزی کەسانێکی جیاوازدا بگەڕێین. ئەمانەیش هەندێ ڕستەی ئامادەی وەکو «خۆمم تێدا بینیەوە» و «دەتوانین هەموو موعانەتەکانی نەتەوەکەمانی تێدا ببینین» و چەندانی تری لەو بابەتەیان خستۆتە ناو لێکۆڵینەوەکانەوە. ڕۆماننووسی ئێمە دەتوانێت سەرجەمی ڕۆمانی خۆی بۆ خوێنەر بخوێنێتەوە و هیچ کێشەیەکی تێگەیشتنی لا دروست نەکات. «سەلیم بەرەکات» و «شێرزاد حەسەن» دوو ڕۆماننووسی کوردن. ئەمیان بە عەرەبی دەنووسێت و ئەویان بە کوردی. ئاسان نییە لای «سەلیم بەرەکات» لە دێڕێکەوە بگەیتە دێڕێکی تر. وردەکارییەکان ناهێڵن بەئاسانی تێبپەڕیت. ئەو زمانە ڕاتدەگرێت.. لەناو ڕێگومکەکاندا ون دەبیت و نازانی بە چ ئاڕاستەیەکدا دەڕۆیت.. هەرگیز ڕێک ناکەوێت خوێنەر بتوانێت بیرۆکەکانی ڕۆمانی «سەلیم بەرەکات» کورت بکاتە و بۆ کەسێکی تری بگێڕێتەوە، چونکە «بەرەکات» بەهەمان شێوەی «بەختیار عەلی» تێگەیشتن بە جۆرێک لە داگیرکردن دەزانێت. داگیرکردنیش واتە کوشتنی هەموو بەها هونەرییەکانی ناو تێکست.. بەلام دڵنیام «شێرزاد حەسەن» لە کۆڕێکدا «تەمی سەر خەرەند»ی خۆی بخوێنێتەوە، زۆربەی گوێگران بێ هیچ تەنگوچەڵەمەیەک لێی تێدەگەن.

بەڵێ، ئەو چیرۆکنووسەمان لە کورتیکدا چیرۆکێکی درێژی خۆی خوێندۆتەوە، پێش ئەوەی بڵاوی بکاتەوە، برادەرێک لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژی لەبارەیەوە نووسیوە. ئایا ئەمە کارەسات نییە..؟! من بۆیە «شێرزاد حەسەن» بە نموونە دەهێنمەوە، چونکە چیرۆکنووسێکی باشی ئەمڕۆمانە و تا ئێستا تەنیا بەلایە پۆزەتیڤەکەیدا خوێندراوەتەوە. من لێرەدا تەنها مەبەستم ئەوەیە، کە من زۆر بەئاسانی لە چیرۆک و ڕۆمانەکانی «شێرزاد حەسەن» تێدەگەم، چ وەکو کارەکتەر چ وەکو ڕووداو چ وەکو زەمەن و چ وەکو تەکنیکی خوڵقاندنی پەیوەندیی نێوانیشیان. تا ئێستایش هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بارەی ئەدەبی ئەو چیرۆکنووسە بەهرەمەندەشمان نووسراون، بەلای شێوازی نووسینیدا نەچوون. لەیەکچوونی تێکستەکان یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی کوردی.. دیارە لێرەدا مەبەستم لەیەکچوونی دیدگایە، نەک ڕووداو و کارەکتەر و شتەکانی تر. ڕۆمان، کە وەکو پێشتر وتمان بەرهەمی شارستانیەتی ڕۆژئاوایە، ڕۆماننووسی کورد هەوڵی داوە بە شێوازی گێڕانەوەی هەقایەتی کوردەواری مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئینجا چونکە هەقایەتی کوردی ستەرەکچەرێکی لاوازی هەیە، ئەوا ناتوانێت هیچ وزەیەکی پێ ببەخشێت و تایبەتمەندێتیی بۆ بخوڵقێنێت، بگرە هەموو ڕەمزییەتەکانی دەکوژێت. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو شێوازە هەقایەتییە ئەوەیە، کە کارەکتەر دەبێت سادە و ڕووداو تەواو بێت. ئەمەیش خوێنەرێکی پاسیڤی خوڵقاندووە. «مارکیز» سەرەتا لەژێر کاریگەرێتیی «فۆکنەر»دا دەینووسی، بەڵام چونکە گێڕانەوە لە فۆلکلۆری ئەمەریکای لاتیندا خاوەنی جۆرێک لە دەستەڵاتی هونەری بوو، ئەوا ئەدەبی ڕۆمان لای «مارکیز» و زۆربەی ڕۆماننووسانی ئەوێ فۆرمێکی باشتری دەستکەوت. نووسەری ئێمە نەیتوانیوە خۆی لە دەستەڵاتی ئەو هەقایەتە ڕزگار بکات، بەڵکو ئەو تەکنیکانەیش، کە بەرهەمی دەرکەوتنی تەنکەنەلۆژیای ڕۆژئاوان، ئەم دەیانهێنێتە سەر ئاستی ئەو شێوازی هەقایەتییە و بەئەقڵی مانیفاکتۆریانە بەکاریاندەهێنێت. بۆ نموونە ئەو شێوازەی، کە پێی دەوترێت «التداعی الحر» «Free Association» و لە سەرەتای سەدەی پێشووەوە لەسەر دەستی ڕۆماننووسانی وەکو «جیمس جۆیس» و «فرجینا ولف» و هەندێکی تردا هاتە کایەوە، ئەوە سی ساڵ زیاترە گەیشتۆتە ئێمەیش، بەڵام بەشێوە هەرە سادەکەی، بەو شێوەیەی، کە لەگەڵ بنەمای هەقایەتی خۆماڵی دژایەتی ناهێنێتە گۆڕێ.. ڕستەکانی چیرۆک و ڕۆمانی ئێمە لە ڕووی گراماتیک و لۆژیکەوە تەواون. لێرەدا مەبەستم ئەوەیە نووسەران پەیڕەوی گراماتیکیان کردووە، نەک چاک بەکاریانهێناوە.. بیرۆکەکان هەمان ئەندازەی ئەو وشانەیان هەن، کە ڕستەیەک پێکدەهێنن. لە ڕستەشدا کردار گرنگترین

شتە، بۆیە تێکستی چیرۆک و ڕۆمان تەنها یەک ئاڕاستەی ئاسۆییان هەیە، کە بەردەوام خوێنەر بەسەر ڕێگایەکی فلاتدا دەبەن و ناهێڵن بەملا و بەولادا بچێت. واتە نووسەر لە هەوڵی بەردەوام دایە، کە ڕێنومایی خوێنەر بکات و بیرۆکەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێت، هەر بۆیە لە کۆتاییدا یەک جۆر خوێنەرمان هەیە و ئەو خوێنەرەیش ئەوەندەی نووسەر بێ کەم و زیاد بە دنیای ئەو تێکستە ئاشنایە. زەمەنیش هەر ئەو زەمەنەیە، کە ئەو ڕستەیە لە درێژەی تێکستەکەدا دەریدەخات. گێڕەوەر «Narrator»ێک هەیە ئاگای لە تەواوی ژیانی کارەکتەرە سەرەکییەکەیە و بەزمانێکی شەفاف و پڕ لە ئاگایی کەم کەم هەموویمان بۆ دەگێڕێتەوە. لەسەرەتاوە تا کۆتایی کۆنترۆڵمان دەکات و تەنها وەکو گوێگر بەکارماندەهێنێت. «زاهیر ڕۆژبەیانی» ناو لەو شێوازە دەنێت «مۆنتاژی میکانیکی» و وەکو تەکنیکێکی سادەش دەیناسێنێت. زۆربەی ئەدەبی «شێرزاد حەسەن» بەم شێوازە نووسراوە. مەبەستم ئەوەیە، کە لە هەموو چیرۆک و ڕۆمانەکانیدا گێڕەوەر ئەرکی بنیاتنانی پرد دەبینێت، بۆئەوەی خوێنەر بەئاسانی لە ڕووداوێکەوە بگەیەنێتە ڕووداوێکی تر، کە زۆربەی کاتیش ئەو ڕووداوانە بەشێوەیەکی کرۆنۆلۆژی دەردەخرێن. ئەوەندە هەیە گێڕەوەر لە پێش ئێمەوە ئەو زانیارییانەی پێ گەیشتووە و ئەویش بە ئێمەیان ڕادەگەیەنێت. ڕاستە ئەو ڕووداوانە سەرنجڕاکێشن، پڕن لە بوێری، بەڵام ئێمە ئێستا باسمان لە لایەنی هەونەرییە. ئەو ڕایانەم ئەوەم لەبیر نابەنەوە، کە «شێرزاد حەسەن» لە هەندێ ڕووی ترەوە گۆڕانکاریی گەورەی لە چیرۆکی کوریدا کردووە. نابێ هەموو خەتاکان بخەینە ئەستۆی ڕۆماننووسانەوە، بەڵکو زۆربەی ئەو نووسەرانەیش بێگوناه نین، کە لەبارەی ڕۆمانی کوردییەوە دەنووسن. تۆ بڕوانە ئەوە زیاتر لە دە ساڵە ڕۆمانی کوردی بووەتە بابەتی لێکوڵینەوە، کەچی تا ئێستایش چەمکەکانی وەکو کارەکتەر و ڕووداو و زمان و کات و شوێن و گێڕانەوە و زۆر شتی تر بەهەمان سادەیی جاران ماونەتەوە. ئایا سبەینێ کاتێ «توانا ئەمین» دەیەوێت باسێک لە بارەی ڕۆمانەوە بنووسێت، دەتوانێت ئیش بەو نووسینانە بکات، کە بەردەوام لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانماندا بڵاو دەبنەوە و ڕۆمانەکان هەڵدەسەنگێنن..؟! ئایا ئەو نووسینانە توانیویانە کار لە دیدگای ڕۆماننووسی ئێمە بکەن..؟! ئایا توانیویانە خوێنەرێکی جدیی ڕۆمان پێبگەیەنن..؟! ئەگەر وەڵامی ئەو پرسیارانە نەخێرن، کەواتە نابێت ئەو نووسینانە ببنە پێوەرێک بۆ چاکیی ئەم ڕۆمان و خراپیی ئەو ڕۆمان. زۆربەی ئەو نووسەرانە، ناڵێم هەموویان، هەندێ ڕۆمانی زۆر سادەیان لێمان کردۆتە شاکار و لە چاکترین حاڵەتدا جارێکی دی ڕووداوەکانیان بۆ گێڕاوینەتەوە. ئەو نووسینانە بۆ ڕۆماننووسی ئاساننووس

بەلەزەتترین خۆراکن بۆ بەرهەمهێناوەی ڕۆمانی ساکار و بەردەوامبوونی لەسەر یەک ستایلی دیاریکراو. کاتێ ئەو ڕایانە دەردەبڕم، دەشزانم لەم ڕووەوە کەمێک هەوڵی جوانمان هەیە. دەتوانم تەنها بۆ نموونە، نەک بۆ مەبەستێکی تر، هەوڵەکانی «ئازاد سوبحی» و «سەمەد ئەحمەد» و «عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا» و «نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد» و «نیهاد جامی» و بەبیر خۆم بهێنمەوە. بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم هەر خوێنەرێکی ئاسایی، ئەگەر ئەو وەهمە نەبێت، کە پێی وایە وشەی نووسەر لە دنیایەکی ترەوە هاتووە، ئەوا دەتوانێت وەکو زۆربەی ئەو ڕۆمانانەی ئێمە بنووسێت. خۆ دەرکەوتووە ئەو پێشمەرگە و کادیرانەی ژیاننامەی خۆیانیان نووسیوەتەوە، بە دەیان قات لەو ڕۆماننووسانە بەهرەمەندترن. چیرۆکنووس و ڕۆماننووسی ئێمە لە گفتوگۆکاندا هەرگیز بەلای شێوازی نووسیندا ناچن. ئەوان دەڵێن لە فلان سەردەم و لە فلان شوێندا چیرۆک و ڕۆمان بۆ یەکەمین جار لە دایک بوون. لەملا ڕۆمانی ئینگلیزیمان هەیە و لەولاش ڕۆمانی فەرەنسی. کوردیش بۆتە خاوەنی چیرۆک و ڕۆمانی خۆی. لەگەڵ دەیان قسەی تری لەم بابەتە. ئەمەش زۆر ئاسانە. هەر کەسێ ئەو گۆڤار و کتێبانەی هەبێت، کە لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا دەرچوون، دەتوانێت ئەم گوتانەیان لەبەر بنووسێتەوە. بۆئەوەی خوێنەر بزانێت ئێمە چۆن لەو هونەرە تێگەیشتووین، دەبێت بۆی بدوێین. بەهەرحاڵ ئەمە تێگەیشتنی منە بۆ شێوازی نووسینی ڕۆمان. ماوەتەوە بڵێم ڕۆمانی کوردی نەیتوانیوە هیچ پرۆبلەماتیکێک بەرهەم بهێنێت و ڕێگای بۆ خوێندنەوەی جیا جیا خۆش نەکردووە. کەواتە دوورە لە هەموو مەترسییەکی نەخۆشی و لەناوچوون. پێم وایە هێشتا ماویەتی ئێمە باس لە قەیرانی ڕۆمانی خۆمان بکەین، چونکە هەموو کێشەکان لە ژیانەوە دەست پێدەکەن. ئەو یەک دوو ڕۆمانەی، کە ناچنە ناو ئەو سادەکارییەشەوە، ناتوانن ئەو بۆشاییە گەورەیەمان بۆ پڕبکەنەوە. ئێمە کاتێ ڕۆمان دەنووسین خۆمان لەبەردەم سێڕیانێکدا دەبینینەوە، ئایا ڕۆمان بنووسین وەکو ئەوەی ڕۆماننووسان لە دەرەوەی ئێمەدا دەینووسن.. مەبەستم لاساییکردنەوە نییە و ئەو ڕۆماننووسانەیش دەڵێم، کە گۆڕانیان لەو ئەدەبەدا کردووە.. یان ڕۆمانی کوردی بنووسین، کە تا ئەم ساتەیش نەمانتوانیوە لە ڕەگەزی هەقایەت جیای بکەینەوە. یان هەوڵی پێکهێنانی گوتارێکی تری ڕۆمان بدەین.. دیارە لێرەدا مەبەستم شێوازی نووسینە، نەک بابەتی نووسین، کە لە نووسەرێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت. من ئەو پرسیارە ئاوا بەکراوەیی جێدەهێڵم.